

# بۆ گۆرپەکان




# چاوپۆشی





حبیب محمد سعید

بسم الله الرحمن الرحيم

« بۆ کوڕیەکان »

زنجیرەیەکە - بە کۆمەکی و پشتیوانی خوای گەورە - پێشکەشی کوڕیە و جگەرگۆشە ئازیزەکان دەکەین، بە هیوای وەرگرتنی ڕەوشت و پەروەردەیەکی بەرز و پیرۆز، تاکو ڕێگای ژیانی مەردانە بگرنە بەر و، مەبەستیان ڕەزامەندیی پەروەردگار بێت ..

چیرۆکی یەکەم

# مافی دراوسێیەتی

(( ١ ))

سەردار و شەیمای خوشکی لە حەوشەکەی خۆیاندا بە تۆپ یارییان دەکرد . بە دەنگێکی پاڵ و دەنگی ناسک و تێکەڵ بە پێکەنینی دەروون پاکی کاڵیەکی بێ گەردیان دروست کرد بوو ..

سەردار : ها شەیما بیگرە .

شەیما : ها سەردار گیان بۆ خۆت .

سەردار : دەی نەکەوێت .

شەیما : نایەڵم .

سەردار : ( تلەیەکی لێ دا ) کەوت !

شەیما : ئەمجار ..

سەردار : ها ..

تۆپەکە بە سەر دیواری حەوشەکەیاندا چووە ئەودیو .. هەردووکیان مات بوون .. لەو دیوەوە قرەقرێ دروست بوو . کامیان بچێ بۆ تۆپەکە ، هەریەکەیان سەیری ئەوی تری دەکرد ، کە دیار بوو حەزی دەکرد خۆی نەچێ بۆی . سەردار شەیمای ناچار دەکرد بچێ بە دوایا بەڵام دیار بوو خوشکە بچکۆلەکەی بەم تەمایە نەبوو ..

قرەقرەکە زیاتر بوو. لەگوێیان گرت لێ گەیشتن کاک مەجیدی دراوسێیانە و تووڕە بووە .

مەجید : ئەمانە ئەرکی دراوسێیەتی نازانن .

ژنەکەی : دەی پیاوەکە قەیدی نیە و منالن لە حەوشەی خۆیانا یاری دەکەن .

مەجید : ئاخر نابێ دەست درێژی بکەنە سەر دراوسێ .

ژنەکەی : ئەوە دەست درێژی نیە . مالی کاک ئیبراهیم رێزی هەموو کەسێ دەگرن و منالەکانیان نموونەی منالی خاوەن پەروەردەن .

مەجید : ئەوە پەروەردەیە تۆپەکە دەخەنە نــاو گولە میناکەمانەوە ؟

ژنەکەی (لە سەرخۆ) : راست دەکەی، بەلام خۆ بە دەست قەست نەیان خستووە وگولەکانیش هیچ زیانێکیان پێ نەگەیشتووە .

مەجید : دە تۆ ئەو چەقۆیەم بۆ بێنە .

ژنەکەی : پیاوی چاک بە ، با دلی کاک ئیبراهیم وشەونم خانمی لێ نەیەشێ . واز بێنە با ئەم جارە تۆپەکەیان بەرنەوە .

مەجید : نەو . ئەبێ ژیریان کەم بۆ جارێکی تر .

مەجید رای کرد و لە مزبەقەکە چەقۆیەکی تیژی هێناو تا سەردار تەقەی لە دەرگا داو بۆیان کردەوە ، تۆپی هەلقلیشاندو فرێی دایە بەردەمی سەردار .

سەردار کە چاوی بە تۆپەکەی کەوت پرمەی گریان گرتی و دەستی دایێ و هەلی گرت و بەگریانەوە خۆی کردەوە بەمالی خۆیانا.

مەجید چاوی چەپیبووە تەوێتی سەرێت .. گیقی کردبوو..

هەلوێستە ئەلەکەی هەموویانی مات کرد .. شەوان کوری زۆری پێ! ناخۆش بوو - چونکە خۆی کە تۆپی نەبوو یاری پێ بکا ،

سەردار نموونەی هاوەڵی بەرچاو ڕوون بوو و هەموو جارێ لە گوڕەپانی نزیکی ماڵەکەیاندا بانگی دەکردە شوان تا پێکەوە یاری بکەن - ڕووی کردە باوکی .

**شوان** : بابە گیان چۆن دڵت هات ئەو تۆپەت هەڵ دڕی؟

مەجید : جا تۆ بۆ پێت ناخۆشە کوڕم ؟

شوان : چۆن بابە گیان ؟ کاکە سەردار نموونەی دراوسێی ڕەوشت بەرزە لەگەڵما . ڕێزی زۆرم لێ دەگرێ.. هەموو جارێ بانگم دەکات و بۆ دڵخۆش کردنم یاریم لەگەڵ دەکات .

ژنەکەی : پێم وابێ وا مەکە ، باوکی شوان . چەند گوناحە منداڵێکی وا بەستەزمان دڵ شکست بکەی ؟

شوان : ئیتر چۆن لە ڕوومان بێت سەلامیان لێ بکەین؟

سەردار بە گریانەوە خۆی کردەوە بە ماڵی خۆیاندا و تۆپە دڕاوەکەشی بە دەستیەوە بوو .. خێرا شەیمایش دەستی کردە گریان و دایکیشیان هات بە دەمیانەوە .

شەونم : سەردار ، شەیما ڕۆڵە ئەوە بۆچ دەگریێن ؟

سەردار : کاکە مەجید تۆپەکەی دڕاندم .

شەونم : دەستی خۆشی بێت ، ئەی نابێ ئاگادار بی تۆپەکە نەچێتە ناو گوڵەکانیانەوە ؟ ئەی چەند جار لەگەڵ باوکتا باسی ڕێزلێگرتنی دراوسێمان بۆتان کرد ؟

دەنگی گریانی سەردار بەرز بۆوە . شەونم سەری لێ نەگەیشتنی ئەو سوورِ دەما ! چۆن ئەبێ پیاو ئەوەندە بێ چیقڵدان بێت ؟ زۆر بە زەییشی بە کوڕەکەیا دەهاتەوە ، بەڵام ئیزانە خۆی گرت .

شەونم : وەرە کوڕی خۆم قەیدی نیە ، کاکە مەجید لە جێی خاڵتە .. دەبوا نەکەیتە کارێ لێمان زویر بێ .

ماڵی مەجید چاک گوێیان لە دەنگی شەونم خان بوو..
ژنەکەی لە شەرما لەپێ دەستی کێشا بە ڕوومەتیا و چاوی زاق بوو بوو وەهەناسەی وەرتەدەگرت تا چاک گوێی لە وتەکانی بێ .. مەجیدیش لە شەرم و خەجاڵەتیا ڕەنگی هەڵگەڕا بوو .. شوانیش بە ماتەمینی یەوە ڕووی کردە باوکی .

شوان ( بە دەنگی نزم ): ئەها بابە گیان چۆن ئابڕوومان چوو؟

مەجید : ڕۆڵە تاوانی منالەکانی خۆیان بوو .

شوان : ئاخر لە سەر هەڵەی منالێکی وەها نابێ ئێمە دڵی دراوسێ برەنجێنین .

ژنەکەی : دراوسێی وەک کاک ئیبراهیم و شەونم خان .

شوان : یان کوڕی دڵ پاکی وەک سەردار .

مەجید : دە ئیتر بێ بڕنەوە و زۆر لە سەری مەڕۆن .

ژنەکەی : پیاوەکە ئەبێ کارێ بکەین دڵیان گەرد نەگرێ .

مەجید : جا چی بکەم ؟

ژنەکەی : ئەوە خۆت دەزانی .

مەجید : خۆ ناچم دەست و پێیان ماچ کەم .

شوان : وا نا ، بەڵام ئێوارە لە گەڵ دایکما سەرێکیان لێ بدەین و عوزر خوایی بێنینەوە .

مەجید : هەرگیز تاقەتی شتی وام نیە .

ژنەکەی : پیاوەکە ، شوان ڕاست دەکا ، ئەگەر تۆیش لە ڕووت نایێ من و شوان دەچین .

مەجید : نایەڵم ئێوەش بڕۆن .. ئەوان تاوان باران .

ژنەکەی : ئەوە کەی تاوانە پیاوەکە .. تۆ پێت خۆشە کەسێ دڵی شوان بشکێنێ ؟

مەجید ( دەستێکی هەڵتەکاند ) : ئیتر .

نابەڵێین ماڵی کاڵە مەجیدیشی لێمان بڕەنجێت .

ئیبراهیم : بەخوا ژنەکە من وام پێ خۆشە خزمەتی کاری ئەو دراوسێیە بکەم . بەخوا یەڵێ دراوسێ لێ نزیکبێ ئەم خانووەم لەبەرچاو دەکەوێ .

شەونم : پیاوەکە هەموومان هەروایین . هەرگیز نابەڵم دڵی دراوسێیەم لێ بێشێ . ماڵی کاڵە مەجیدیش دەخەمە سەرچاوم و لەجێی هەمووکەسێکمن .

ئیبراهیم : دەی پێم بڵێ سەردار چی کردووە ؟

شەونم : لەگەڵ شەیمادا بە تۆپەکە یاریان دەکردو نەیانزانی کەوتە حەوشەکەی کاڵە مەجید .

ئیبراهیم : پێ بەڵێت سەردار ، نەدەبوو بیبێتە مایەی زەحمەت بۆ ماڵی کاڵە مەجید .

شەونم : ئیتر لە دەستی دەرچوو وکاڵە مەجیدیشی توورەکرد تا تۆپەکەی بەچەقۆ دڕی .

ئیبراهیم : ئێ ، ئێ . ئەمە بۆ تۆپەکەی دڵی پڕە . تا بانگی کەبۆم.

شەونم : سەردار ، سەردار ، وەرە بۆلای باوکت ..

سەردار دێتە دەرەوە للای باوکی .

سەردار : فەرموو بابەگیان .

ئیبراهیم : کوری شیرینم خەفەت نەخۆی بۆ تۆپەکەت ، هەر ئێستا دوو تۆپ دەکرم ، یەکێ بۆ تۆ و یەکێکیش بۆ شوانی کوری کاڵە مەجید ، بەڵام بەو مەرجەی ئێرانەو برایانە لە یاریگا یاری بکەن و شوان بەبرای دڵسۆزت بزانی .

سەردار : بەچاوان بابەگیان . لەبەرخاتری شەیماگیان لێرە یاریم کرد..

ئیبراهیم : هیچ گوێی نەدەیتێ ، خۆمان دڵی کاڵە مەجید دەدەینەوە . ئێستا هەستە با بچین بۆ بازاڕو تۆپەکان بکڕین .

سەردار لەگەڵ باوکیا چوون بۆ بازاڕو بەدڵی خۆی

دوو تۆزێ چاکی هەڵ بژارد و گەڕانەوە ماڵەوە .

(( ٣ ))

ڕۆژ زۆری نەمابوو، بۆیە وایان بە چاک زانی شەو بچن بۆ ماڵی کاک مەجید تا دڵی بدەنەوە و تۆپەکەش پێشکەش بە شوان بکەن.

کە شەو ڕۆیشتن سەیر ئەکەن خزمێکی کاک مەجید وا لەوێ میوانە. دوای سەلام و بەخێرهاتن، ئیبراهیم سەرنجی دا مەجید زۆر پیرنیە بەڵکو شەرمەزارە، بۆیە ڕووی تێ کرد و بە زەردەخەنەیەکەوە وتی :

ئیبراهیم : کاک مەجید گیان شەرمەزاری ئەو هەڵوێستەی سەردانم.

مەجید : بە پێچەوانەوە کاک ئیبراهیم من شەرمەزارم . نەئەبوا دڵی سەردارمان بشکاندبایە .

ئیبراهیم : سەردار دەکەمە قوربانی دڵی هەموو دۆست و دراوسێیەک .

مەجید : خوا سەردارت لێ نەسێنێ . سەردار نموونەی منداڵی دڵ پاک و بە وەفاو بەڕەوشت بەرزە .

شوان : بە ڕاستی کاک سەردار مایەی شانازیمانە . چونکە خاوەنی دڵ و دەروونێکی زۆر پاکە و لە ڕادە بەدەر ڕێز لە هاوەڵانی دەگرێ .

ئیبراهیم : شوان گیان . هیوادارم ئێوەی بەرەی تازە بە ڕەوشتێکی بەرزەوە ژیان ببەنە سەر .

شوان : کاک ئیبراهیم ، ئێمە شانازی دەکەین بە دراوسێی دڵسۆزی وەک جەنابتەوە .

دایکی شوان : کاک ئیبراهیم ، خوای گەورە ئاگاداری نیازی هەموو دڵێکە : سەردار و شوان فەرق ناکەم . بەڵام نەئەبوا زەحمەت بکێشی .

ئیبراهیم : هیچ زەحمەت نیە ، تەنها پێم خۆشە شوان گیان دڵ خۆش

بێت و لە جاران زیاتر لەگەڵ سەردارا یەکیان خۆش بوێت و پێکەوە یاری بکەن.

شوان: زۆر سوپاست دەکەم کاکە ئیبراهیم گیان.

لێرەدا میوانەکەیان، کە ناوی مەحموود بوو، تێ گەیشت مەجید حەزی پولە و حەولەیەکی کردووە. بۆیە پێی خۆش بوو ئەویش باسێکیان پێشکەش بکا.

مەحموود: پێرێکیان سواری ئۆتۆمبێلێ بووم.. ڕێگاکە زۆر دوور بوو، پیاوێکیشی لە تەنیشتما دانیشتبوو.. هەر یەکەم جار دیار بوو ماندووە، کە هەندێ ڕێگامان بڕی، خەوی پیا کەوت. دوای ماوەیەک جوولا و شانی کەوتە سەر شانم و ماشاءاللە قورسیشی بوو.

مەجید: ئێ دە هەڵتە ساندایە.

ئیبراهیم (سەیری مەحموودی کرد) بەڵێ.

مەحموود: دیار بوو ماندوو بوو.. ماوەیەک بوو [بوو] نەخەوت.. هەرچەندم دەکرد دڵم نەدەهات بە خەبەری بکەمەوە. لە بەر ڕەزامەندیی خوا شانم دایە ژێر شانی و ملی و خۆم کردە پاڵپشتی بۆی، ماوەیەکی زۆر ڕۆیشتین هەر بە خەبەر نەهات.. بە یەکجاری نارەحەت بووم..

مەجید: بێ بەتێبجێ، خەتای خۆت بووە..

مەحموود: وتم من تازە پیاوەتیەکەم کردووە، خوا کردمەڵێ بێت بە شکوم تا سەر ڕێ بەم.

ئیبراهیم: هەزار ڕەحمەت لەو شیرەت.

مەحموود: کاکە سەرتان نەیەشێنم، ماوەیەکی تریش ڕۆیشتین، بێ ئەوەی جوولە بکەم، هەتا خۆی بە خەبەر هات. کە سەیری کرد، وا بە سەر شانی

منەوە خەوتووە ، بە پەلە خۆی ڕاست کردەوە و بەو پەڕی شەرمەزاری یەوە داوای لێ بووردنی لێ کردم. منیش وتم: براگیان ، هیچ پێویست بەوە ناکات. ئێمە براین.. ئێستە وەک دراوسێی واینە و ماڵمان بە سەر یەکترەوە هەیە. دیار بوو ئەوینی مرۆڤێکی ڕەوشت بەرز بوو ، لە ڕادەبەدەر ڕێزی منی دەگرت و پاشماوەی ڕێگاکەمان بە باس و بابەتی ڕێک و پێک بە سەر برد و بە چاودێری خوای گەورە بە سەلامەتی گەیشتینە بەرەوە.

مەجید: بە ڕاستی ئەمەش هەروانەیەکی بە نرخ بوو بۆ من. هەمیشە بە پەلە و هەڵە دڵی خەڵک ئازار دەکەم و دواییش شەرمەزار دەبم و داوای لێ بووردن و چاوپۆشی دەکەم..

چیرۆکی دووەم

# تامنش پەروەردەکات

دەستەیەکی زۆر بێ ویژدان بوون.. دەستیان لە هەیا و ئابڕوو شۆرد بوو.. بە نهێنی و بە ئاشکرا خەریکی دزی و جەردەیی بوون.. ناوچەی (سید صادق) بە دەستیانەوە گیری خواردبوو. هەرشەوە و تەپیان دەکوتایە سەر ماڵێک بۆ ڕووت کردنەوە و تالان کردن.

ترسی قیامەت لە دڵیانا هەڵ گیرا بوو.. ڕۆژگاری بێ سەروبنیش باڵی پشتی ئەم بەرەڵڵایی و خوانەناسی یە بوو.

چەندێ ئامۆژگاریی دەکران بێ سوود بوو و، ماددە و دەوڵەمەندیی چاوی کوێر کردبوون .. سۆز و بەزەیی لە دڵیانا هەڵگیرا بوو.

شەوێکیان یەکێ لەو دەستەیە دەچێتە سەر جادە بۆ جەردەیی .. زۆری پێ ناچێ ئۆتۆمبێلێکی غاز دەردەکەوێت .. دەستی لێ ڕادەگرێت - شۆفێر وای بە حاڵ زانی نەوەستێنێت، لە داخا تفەنگی لێ ڕاکێشا و بە گوللە تایەی ئۆتۆمبێلەکەی پەنچەر کرد .. ئەمجار شۆفێر ناچار بوو بوەستێنێت .. بە ڕق و قینەوە لێی نزیک کەوتەوە و فەرمانی بە سەرا دا هەردوو دەستی بەرز کاتەوە، تا هەرچی وا لە باخەڵیا دەری بێنێ.

شۆفێرەکە تێگەیشتبوو، سەرنجی داو دزەی ناسی، بەڵام لەبەر ئەوەی دەستی لێ نەوەشێنێ، خۆی ئاشکرا نەکرد.

تایەی ئۆتۆمبێلی گۆڕیی و کەوتەوە ڕێ .. هەرخەریکی سوپاسی خوا بوو کە بەم ئاسانییە لەو بەڵایە ڕزگاری بوو، تیاچوونی پارە و پووڵ و ماڵی دنیا بەلایەوە گرنگ نەبوو.

لە هەمان کاتا بیری دەکردەوە چۆن ڕێگایەک بدۆزێتەوە ئەم تاوانبارەی پێ لەناوبەرێ تا تۆڵەی خۆی بسێنێ و هەزارانیشی لە دەستی ڕزگاریان بێت.

خێرا موسڵمان ئاسایی نەفرینی کردە شەیتان و بە خۆی وت:

ئەمە تێگەیشتنەکەتە لە قورئان؟

ئا بەم شێوەیە دەتەوێ دەستی خۆێشت و موسڵمانانیش ببڕیت؟

تۆڵەسەندن وکینەبازیی دەکەیتە پیشە ؟
تۆڵەسەندن وکینەبازیی زۆر ئاسانن ، چونکە پیشەی ترسنۆك و هیچ لێنەهاتوانن !
برایەکی ئادەمییت سەرگەردان بووەو شەیتان بازیی پێ دەکات ، داخۆ داماوە لەچ هەتوێستێکی نامەردییدا بەسووکیی و ریسوایی تیا دەچێت و بە ڕووی ڕەش و پڕلە خەجالەتی یەوە دەگەڕێتەوە بارەگای خوا ؟!
جا ئەگەر موسڵمانی و ڕزگارکەری چۆن بەزەییت بەو سەرگەردانەدا نایەتەوە ؟
دەبێ حەز بکەی تیا بچێت و شەیتان ئۆخەی کات وا ئادەمی یەکی بەدۆزەخ گەیاندووە ، یان هەوڵ بدەیت خوا هیدایەتی بدات و لەو گاوە ناپەسەندانە دەست هەڵ بگرێت وبێتەوە ریزی بیدارانی دەست و دەم و دڵ پاك ، تا بەشکو سەربەرزانە بەرەو بەهەشت بکەوێتە ڕێ ؟
جا کە تۆ بیر لە تۆڵە وکینەبازیی دەکەیتەوە ، ڕێبازەکەت چی جیاوازە لە ڕێبازی ملهوڕان ؟
کە تۆ ئاواتی تیاچوون و سووك بوونی سەرگەردانانت لە دڵایە ، ئیتر کەی پەیامی "رحمة للعالمین"ت پێیە ؟
پێویستە تۆ لەو ڕێبازە چەوت وچەوێڵە ڕزگاری کەیت ، تا کۆستی شەیتان و شەیتان پەرستان بکەوێت !
بەو شەوە تاریکە بە تاقی تەنیا ڕێگای چۆڵی تەی دەکرد.
لە ناکاو لە خۆی پرسی : جا چۆن ڕزگاری کەم ؟ چۆن هیدایەتی بدەم ؟ ئەو دڵی ڕەش ڕەش بۆتەوە ولە بەرد ڕەقترە !
خێرا بە پێی وانە ئاڵی مزگەوتی ئەم بۆچوونەی بۆ هات :
جا ئەگەر من لەبەردەم سەرگەردانێکا ئاوەها دەستە

پاچوبم، ئەوا دیارە خۆشم خەڵەتاندووە کە بە هیوام مرۆڤایەتی
سەرگەردان هیدایەت وەرگرێ، وە دیارە بەرنامەکەم هیچی تیا
بەستە نیە..نا..نا.. نابێت. ئەم دەستە پاچپیە پێچەوانەی
شایەتمانەکەمە.

دەبێ نیەتی لێ بێنم - نیەت بە ئیخلاسەوە لە بەر-
ەزامەندیی خوا.. ئەوسا پاڕانەوە وکردەوەی چاک!

خوایە کەس ئاگای لە نهێنیی دڵم نیە جگە لەخۆت..
یارمەتیم بدەی بۆ دەرهێنانی ئەم برا سەرگەردانەم لە ناو
جەرەتاوی نەزانیی و بێ ئاگاییدا.

کەگەڕایەوە شارەکەی خۆیان بە بێ دوستان خۆی گەیاندە
مالی جەردە.. تەقەی دا لە دەرگا.. بۆیان کردەوە:

- فەرموو کاکە چیت دەوێ؟
- خوشکەکەم نازانم غازتان پێویست نیە؟
- ئۆی بە قوربانت بم سێ بتڵمان خاڵییە.
- دە بیان هێنە، با بیان گۆڕیم بۆت.
- ئەی خوا لە برایی کەمت نەکا.
- بزانە دەبوو دراوسێ کەی غازی نیە با لە بەرخاتری
ئێوە بۆی بگۆڕم.
- کوڕە بە قوربانت بم بە خوا هەموویان داماون.
- ئەی لە ئەوتا چۆنن؟
- کوڕە باوکەکەم، ئەوتیش وا بە کوڵی شێرەوە و
منیش بە دەستی زەبەلاحێکی تەمەڵەوە گیرم خواردوە
، ئەوتم چۆن دەست کەوێ؟
- خوا کەریمە.
بتڵە غازەکانی بۆ گۆڕین.
- ئەی حەوت برا خۆ ـ من نەمزانی حەوانابت لێیە؟

- ئەوە موحیم نیە، خوا حافیز.
- خوا حافیزت بێ، بە قوربانی ڕێگات بم.
دوای چەند ڕۆژێک هاتەوە و تەقەی لە دەرگا دایەوە:
- براژن گیان، وا نەوتم بۆ هێناون.
- ئەی بە قوربانت بم، بە خوا برا گیان ئێمەت شەرمەزار کردوو.
- دراوسێکانیشتان بانگ کە با سەرەو بەرمیل بۆ ئەوانیش پڕ کەم.
- بە خوا ئەگەر هەر خوا پاداشتت بداتەوە. بەم زستانە سەختە نەوت دەستی دەستادار ناکەوێت.
ئێوارە خاوەن ماڵ هاتەوە..
- پیاوەکە، ئەو کاکەیەی ئەو ڕۆژە غازەکەی بۆ هێناین ئەمڕۆیش نەوتی هێنا بۆمان و لە بەر خاتری ئێمەش سەرەو بەرمیلت بۆ دراوسێکان پڕ کرد.
- بە خوا سەیرە.. هەر کەس من دەیناسم لێم پرسیون کەسیان نەبوون. ئەی ژنەکە نەت پرسی بزانی ناوی چییە؟
- بەڵێ وەڵڵا پرسیم، هەر ئەڵێ ناو مرحیم نیە. بە خوا ئەوەندە موسڵمانە ئەم هەموو کچ و ژنەش لێی کۆ ئەبنەوە، نە چاو بەرز ئەکاتەوە و نە قوورێ ئەبێ. هێشتا موسڵمانی وام نەدیوە.
- ئۆزگە ئەم زانی کێیە..
چەند جارێک نەوت و غازی بۆ بردن، تا بە تەواوی خاوەن ماڵ سەرسام بوو لە پیاوەتی ئەم غازفرۆشە، نەک تەنها لەگەڵ ئەوانا بەڵکو لەگەڵ هەموو گەڕەکەکەدا..
ئەوە بوو ڕۆژێکیان خۆی لە ماڵەوە بوو غازی بۆ هێنان.
- ئەی بەخێر بێیت.

- خوا عەفووت کا ، چۆنی ، منالەکان چۆنن ؟
- خوا سەلامەتت کات . ئەی براگیان حەز دەکەم پرسیارێ بکەم .
- فەرموو .
- تۆ چۆن من دەناسی و ئێم هەمووە شتەت بە ناو دەکیشی ؟
- چۆن نات ناسم ؟ تۆ کارێکت لەگەڵ کردووم هەرگیز لە یادم ناچێت .
- کورە بێ بەڵدبیت ، خۆ خەڵکی وەرچەبای ئێمە مانان هەر ناکەن ، پیاوەتی و چاکەی چی ؟ لە کوێ ؟
- لە بیرتە شەوەکە سەیارەیەکی غازم پێ بوو تەقەت لێ کردم و تایەی ئۆتۆمبێلەکەت پەنچەر کردم و هەرچی پارەیەکم پێ بوو لێت سەندم ؟
کابرا بە خۆجالەتی یەوە عەرەقی ناوچەوانی دەسڕی .. عەرەقی جۆگەلەی بەست .
- لێ ؟ ئەوە تۆ بوویت ؟
- بەلێ من بووم .
- ئەی خۆجالەت خۆم .. ئەی ڕوورەشی خۆم .
- نا ، کەسەکەم .. شەیتانی دوژمنان خەجالەت و ڕوورەشی بێت . بە کۆمەکی خوا خەجالەتمان کردووە .
- ئەی ماڵ کاول خۆم !
- إن شاء الله ماڵ ئاوەدان دەبیت ، لە تۆ ترازام بیرم لە تۆڵە دەکردەوە . خۆ هەرچۆن بوایە دەم توانی دەستێکت لێ بووەشێنم .
- ئەرێ وەڵڵا .
- ئەگەر بۆ خۆت مەجالم نەبوایە ، دەم توانی شەوێ لەماڵ نەبیت ماڵ و منالت لە ناو بەرم .
- کورە برا ، خوایە ئەوەندە ئاسانە هەموو کەسێ

